الحمدُ للَّه، والصَّلاةُ والسَّلامُ على رسولِ اللَّه، وعلى آلِهِ وصحبِهِ ومَنْ والاه، أما بعد:

پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێت: ((داواكردنی زانست لەسەر هەموو موسڵمانێك فەڕزە)) "ئیبن ماجە وئەوانی تر گێڕاویانەتەوە، زۆربەی ئەهلی زانست سەنەدەكەیان بەلاواز داناوە، وە سیوتی و(المزي) بەچاكیان داناوە بەڵام مانای فەرموودەكە ئەهلی زانست لەسەری كۆكن"

بەیهەقی وەك سەرنجێك لەسەر فەرمودەكە گوتویەتی: مەبەست فێربونی زانستی گشتیە -الله زاناترە- ئەوەی پێگەیشتووی ژیر نابێ پشتگوێی بخات. "المدخل الى السنن الكبر ى".

لە ئیمامی شافیعیان پرسی: زانست چیە؟ چی پێویستە لەسەر خەڵكە لەم بابەتەدا؟ گوتی: زانست دو جۆرە: زانستێك كەپێگەیشتوی ژیر نابێت نەیزانێ ئەو زانستەش بریتیە لە قورئان وفەرمودەی پێغەمبەرﷺ ئەمە بێ ململانێ واجبە."الرسالە للشافعی".

زاناكان زانستی شەرعیان لە ڕووی واجبەوە كردوە بە دوو بەش:

یەكەمیان: فەڕزی كفایە: كە بریتیە لەوەی پێویستە لەسەر موسڵمانان فێری بن ولەبەری بكەن جا ئەگەر كۆمەڵێك ئەوەی پێویست بوو پێی هەڵسان چاكە وپاداشتیان بۆ هەیە سزاكەی لەسەر ئەوانیتر لادەچێت، ئەگەر ئەو كۆمەڵە بەكاری پێویست هەڵنەستان ئەوا هەمو موسڵمانان تاوانبارن، نمونەی ئەم جۆرە فێربوون ولەبەركردنی قورئان ولێكدانەوەیەتی، فەرمودە وزانستی فەرمودە، بنەما فیقهیەكان .... تاد. بەشی دوەم لە زانستی شەرعی فەڕزی عەینە: كە فەڕزە لەسەر هەموو كەسێك موسڵمان و پێگەیشتوو وژیر بێت بیزانێت، جا ئەگەر پشتگوێی خست یان كەمتەرخەمی تێدا كرد ئەوا تاوانبارە، گرنگترین ئەو بابەتە بیرو باوەڕیانەی پێویستە موسڵمان فێری بێت ئەوانەی خوارەوەن:

### بابەتی یەكەم: سێ بنچینەكە:

ناسینی الله وئاینەكەیی وپێغەمبەرەكەیﷺ.

ئەگەر پرسیارت لێكرا پەروەردگارت كێیە؟ بڵێ: پەروەردگارم (الله)یە، كە بەنیعمەتی خۆی من وهەموو جیهانی بەدیهێناوە ئەو پەرستر اومە جگە لەو هیچ پەرستر اوێكی بە حەقم نیە.

ئەگەر لێتیان پرسی: ئایینت چیە؟ تۆش بڵێ: ئایینم ئیسلامە، كە بریتیە لە خۆدانە دەستی الله بەتەنها پەرستنی، وە ملكەچ بوون بە گوێڕایەڵی كردنی، وخۆبەری كردن لە شیرك و موشریكان.

ئەگەر پرسیان: كێ پێغەمبەرتە؟ تۆش بڵێ پێغەمبەری من (محمد كوڕی (عبداللە)ی كوڕی عبدالمطلب كوڕی هاشم)ە، وە هاشم لە قوڕەیشە وقوڕەیشیش لە عەڕەب، وعەڕەبیش لەنەوەی ئیسماعیل كوڕی ئیبر اهیمە عليه السلام.

### بابەتی دووەم: بنەمای ئایین دوو شتن:

١: فەرمانكردن بە پەرستنی الله بە تاك وتەنیا وبەبێ هاوەڵ بۆدانان، وە هاندانی خەڵك بۆ ئەوە ودۆستایەتی لەم پێناوەدا وڕق لێبوونەوە لەم پێناوەدا وە دوژمنایەتی كردن لەم پێناوەو وبەكافر دانانی ئەوەی وا نەكات.



٢: ئاگادارکردنەوە لەهاوەڵدانان لە بەندایەتیكردنی الله، وتوندبوون لەسەری، و دوژمنایەتی ئەوەی بیكات و دوژمنایەتی كردنیان وتەكفیركردنیان.

ئەمە بنەمای وەلاء و بەڕاء یش دەگرێتەوە، ئەم بنەمایە پەیوەستە بە جیاكردنەوەی موسڵمان و بێجگە لە موسڵمان لەسەر بنەمای ئایین نەك لەسەر بنەمای خاك ونەتەوایەتی، جا برای موسڵمانم من برای ئایینیم سەردەخەم وخۆشم دەوێ لە پێناو الله ئەگەرچی زۆریش لێم دوور بێت، وە كافر وهەڵگە ڕاوە لە ئایینەكەی دوژمنی منە وڕقم لێیەتی ودوژمنایەتی دەكەم ئەگەر چی لێمەوە نزیكتر ین كەس بێت.

### بابەتی سێیەم: مانای "لا الە الا اللە

جیاكەرەوەی نێوان كوفر وئیسلامە، ئەو ووشەیە خۆپارێزی ودەستگرتنە بە بنەمایەكی بەهێز، ئەوەشیان تەنیا بە ووتنی بە زمان نایەتەدی كاتێ ماناكەی نەزانیت وكار بە ناوەڕۆكەكەی نەكەیت، چونكە دووڕوەكان بەزمان دەیڵێن كەچی لە بنجی بنەوەی دۆزەخدان، بەڵكو پێویستە بە زمان بووترێت وماناكەی تێبگەی وخۆشت بوێت وئەوانەی لەسەر ئەو ڕێبازەن لەگەڵیان بیت لەوانەش دوور بكەویەوە كە سەرپێچی دەكەن بەڵكو پێویستە شەڕیان لەگەڵ بكرێت.

شایەدی دان بە ووشەی (لا الە الا اللە) نەویستی وچەسپاندنە: (لا الە) هەموو پەرستر اوێك جگە لە الله تعالى ڕەت دەكاتەوە، (الا اللە) هەموو بەندایەتی كردنێك بۆ الله بەتاك وتەنها بێ هاوەڵ بۆدانان دەچەسپێنێت.

تەواوكەری"لا الە الا اللە" ش "محمد رسول اللە" یە، ئەمەشیان بە ملكەچ بوون بۆ فەرمانەكانی پێغەمبەرﷺ ودووركەوتنەوە لەو شتانەی نەهی لێكردوووە وباوەڕهێنان بەوەی هەواڵی پێداوە.

### بابەتی چوارەم: مەرجەكانی "لا الە الا اللە":

الله تعالى ئەم ووشەی كردوە بە ناونیشانی چونە ناو ئیسلام، ونرخی بەهەشت، وەهۆكاری ڕزگاربوون لە ئاگر، بەڵام سوودی بۆ خاوەنەكەی نابێت ئەگەر مەرجەكانی تێدا نەبێت، لە "حەسەنی بەصری"یان پرسی: خەڵكانێك دەڵێن ئەوەی بڵێ "لا الە الا اللە" دەچێتە بەهەشت؟ ئەویش گووتی: هەر كەسێك گووتی "لا الە الا اللە"، ئەرك وفەڕزەكانی ئەم ڕستەیەی جێبەجێ كرد دەچێتە بەهەشت. (جامع العلوم والحكم لابن رجب الحنبلی) ئیمامی بوخاری دەڵێ: لە "وهب بن منبه" یان پرسی ئایا "لا الە الا اللە" كلیلی بەهەشت نیە؟ گووتی: بەڵێ وایە بەڵام كلیلێكە ددانەی خۆی هەیە ئەگەر ئەو كلیلەت پێ بێت ئەوا دەرگات بۆ دەكرێتەوە ئەگەر نا دەرگای بۆ ناكرێتەوە. ددانەی كلیلی بەهەشتیش بریتیە لە مەرجەكانی "لا الە الا اللە".

وە مەرجەكانی "لا إله إلا الله" بریتین لە:

١- زانینی: ماناكەی بە ڕەت كردنەوە وچەسپاندنەكانی.

٢- دڵنیابوون: بریتیە لە ناسینی تەواو، ڕەتكردنەوەی گومان.

٣- دڵپاكی: ودوور لە هاوەڵ بڕیاردان.

٤- ڕاستگۆیی: و ڕەتكردنەوەی درۆ.

٥- خۆشەویستنی ئەم ووشەیە: وئەوەی دەیخوازێت، ودڵخۆشبون پێی.

٦- ملكەچی فەرمانەكانی بیت: لە پێناو الله، و ڕازی بوونی.

٧- پەسەندكردنی: پێچەوانەی ڕەتكردنەوەی.



هەموو ئەمانە بەڵگەی ڕوون و ئاشكرایان هەیە لە قورئان وفەرمودەی ڕاست ودروست.

### بابەتی پێنجەم: هەڵوەشێنەرەوەكانی ئیسلام:

ئەو شتانەی موسڵمان لە چوار چێوەی ئیسلام دێنێتە دەرەوە ودەردەچێت لەو خانەیە ئەگەر ئەنجامی دا- دەچێتە خانەی موڕتەد لە ئیسلام زۆرن ئەو هەڵوەشێنەرەوانە بەڵام مەزنتر ینیان دە دانەن بریتین لە:

١ـ هاوەڵ بڕیاردان لە پەرستنی الله تعالى.

٢- هەر كەسێك واسیتەیەك بخاتە نێوان خۆیی وپەروەردگاری خۆی داوای لێبكات و پشتیان پێ ببەستێت.

٣ـ هەر كەسێك موشریكەكان بە كافر دانەنێت یاخود گومانی لە كافركردنیان هەبێت یان ڕێبازیان بە ڕاست دابنێت.

٤- هەر كەسێك پێی وابێت كە ڕێبازێكی دیكە لەو ڕێبازەی بۆ پێغەمبەر دانراوە تەواوترە یان دەستورێكی تر باشتر ە لە دەستوری ئەو.

٥- هەر كەسێك ڕقی لە شتێك بێت كە بۆ پێغەمبەرﷺ ڕەوانە كراوە.

٦ـ هەر كەسێك گاڵتە بە الله وقورئان وپێغەمبەرەكەیﷺ بكات.

٧ـ جادووكردن بەهەردوو بەشەكەیەوە لێك كردن و لەیەك بەستنەوە.

٨ـ پاڵپشتی كردنی موشریكان و یارمەتی دانیان لە دژی موسڵمانان.

٩ـ كەسێك پێی وابێت خەڵكانێك بۆیان هەیە لە شەریعەتی پێغەمبەرﷺدەربچن هەروەك حەزرەتی خضر لە سەر شەریعەتی موسا نەبووعليه السلام.

١٠ـ پشت كردن لە ئاینی الله، نە خۆی شارەزا بكات و نە كاریشی پێبكات.

هیچ جیاوازیەك نیە لەم هەڵوەشێنەرانەی ئیسلام لەنێوان كەسێك بە گاڵتە یان بەئەنقەست یان بەهۆی ترسەوە ئەنجامی بدات تەنها زۆرلێكراونەبێت.

### بابەتی شەشەم: جۆرەكانی (التوحید):

١- تەوحیدی پەروەردگارێتی الله: بریتیە لەوەی پێت وابێت الله خۆی هەموو شتێكی دروست كردوە بەتەنها و بێ یارمەتی كەس وە هەر خۆشی ڕۆزی دەریانە، هەموو كاری ئەم جیهانانە خۆی بەتەنها بە ڕێوە دەبات، زۆربەی خەڵك لەوەدا گومانیان نیە كە الله بەدیهێنەر و ڕۆزی دەر وبە ڕێوەبەر وزیندووكەرەوە وكۆتایی پێهێنە. .... لە دڵەوە دان بەوەدا دەنێن، بەڵكو ئەو كافرانەی پێغەمبەرﷺ شەڕی لەگەڵ دەكردن وخوێن ومالی حەلاڵ كردبوون، ئەوەیان دەزانی، وەك الله تعالى دەفەرموێت: {قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاءِ وَالأَرْض أَمَّن يَمْلِكُ السَّمْعَ والأَبْصَارَ وَمَن يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيَّتَ مِنَ الْحَيِّ وَمَن يُدَبِّرُ الأَمْرَ فَسَيَقُولُونَ اللَّهُ} [يونس: ٣١]. بەڵام تۆ كە دەزانی الله بەدیهێنەر و ڕۆزی دەرتە .. بەس نیە بۆ ئەوەی بتخاتە نێو بازنەی ئیسلام ئەگەر تەوحیدت لە بەندایەتیكردندا بۆ الله نەبێت.

٢- تەوحید لەبەندایەتی بۆكردن:

بریتیە لەوەی بزانی هەموو بەندایەتیەك شایەن بە (الله)یە وەك داوالێكردن ونەزر كردن قوربانی كردن بۆی و تكالێكردن و ترسان لەو ولە خۆشی وناخۆشی هەر ئەو بناسیت وگەڕانەوە بۆ لای ئەو وپشت بەست بە تەنها بە ئەو پەنا گرتن بەو وبەگەورەدانانی ئەو وچەمانەوە بۆ ئەو جیهاد كردن لە پێناو ئەو ..... بە واتا بەندەكان ئەو بەندایەتیانە دەكەن تەنها بۆ نزیك بوونەوە لە الله، جا ئەگەر وایكرد ئەوا



موسڵمانێكی موەحیدە، بەڵام ئەگەر بەندایەتیەكی كرد بۆ نزیك بوونەوە لە جگە لە الله یان هەندێكی بۆ الله كرد وهەندێكی بۆ بێجگە لە الله، ئەوا تەوحیدی تێدا نەهاتۆتە جێ ودەكەوێتە ناو بازنەی هاوەڵ بڕیاردان بۆی پەنا بە الله.

تەوحید لە بەندایەتی كردندا ئەو بنەمایەیە كە پێغەمبەرانی لە پێناو ڕەوانە كراوە لەو كاتەی هەمویان بانگی خەڵكیان دەكرد بۆ بەندایەتی الله تعالى بەتەنها پەروەردگار دەفەرمویەت: {وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولاً أَنِ اعْبُدُواْ اللَّهَ} [النحل: ٣٦]، (نوح و هود و ساڵح و شوعەیب)یشعليهم السلام هەمان ووتەیان بە نەتەوەكەیان فەرمووە {يَا قَوْمِ اعْبُدُواْ اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـهٍ غَيْرُهُ} [الأعراف: ٥٩، ٦٥، ٧٣، ٨٥].ئەم جۆرە تەوحیدە بوە وایكردوە ناكۆكی بكەوێتە نێوان پێغەمبەران ونەتەوەكانیان چ لە كۆن وتا ئێستاش، هەر ئەم جۆرەی تەوحیدەش بوو پێغەمبەرﷺ شەڕی لەگەڵ كافرەكانی قوڕەیش بڕیاردا ولەدوای ئەویش جێنشینەكانی شەڕیان لەگەڵ هەڵگەڕاوەكان كرد.

٣- تەوحیدی ناو و سیفەتە كانی الله:

ئەمەیان بریتیە لە باوەڕ هێنان بە هەموو ئەو ناو وسیفەتانەی كە لە قورئان الله خۆی پێ وەسف دەكات ولە فەرمودەكانی پێغەمبەرداﷺ بە شێوە تەواوەكەی هاتوە، بڕوا بەوە بكەی كە {لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ البَصِيرُ} [الشورى: ١١]،هیچ شتێك لە ئەو ناچێت وئەویش لە هیچ شتێ ناچێت. بەوشێوەیە باوەڕمان بەو ناو وسیفەتانە هەبێت كە سەلەفی ساڵح تێیگەیشتوون، ئەو ناو وسیفەتانەی لە قورئان وفەرمودەدا هاتون باوەڕمان پێی هەبێت، كەس بۆی نیە -هەر كێ بێت، ناوێك لەخۆیەوە دروست بكات یان سیفەتێك بداتە پاڵ الله، چونكە ئەم ناو وسیفەتانە دیاریكراون، لەوێدا دەوەستین كە الله خۆی بۆ خۆی بڕیار داوە وخۆی پێ وەسف كردووە، وەیان پێغەمبەرﷺ ناوی بردوە و وەسفی كردوە. ناوەكانی الله تعالى هەمووی چاكن، ژمارەیان زۆرە وەك: (الصمد، البارئ، السمیع، البصیر، الرحمن، الرحیم).... هەروەها سیفەتەكانیشی بەرزن وەك (الرحمة، القوة، الحكمة، الحیاة، العزة، العلم، الجبر وت) .....

### بابەتی حەوتەم: جۆرەكانی شیرك:

١- شیركی گەورە: ئەمەیان تاوانێكی گەورەیە الله لە خاوەنەكەی خۆش نابێت وكاری چاكی لێوەرناگرێت، پەروەردگار دەفەرموێت: {الله خۆش نابێت لە شیرك وخۆش دەبێت لە جگە لەشیرك لەوەی كە بیەوێت} [النساء: ٤٨]، هەروەها دەفەرموێت: {بەڕاستی ئەوەی شیرك بكات ئەوە الله بەهەشتی لەسەر قەدەغە دەكات وسەرەنجامیشی ئاگرە وە هیچ سەرخەرێكیش نیە بۆ ستەمكاران} [المائدة: ٧٢]، وە دەفەرموێت: {ئەگەر شیركت كرد ئەوە كردارەكانت هەڵدەوەشێنەوە و لە زیانمەندان دەبیت} [الزمر: ٦٥].

شیركی گەورە چوار جۆرە، ئەوانیش: أ. شیركی داواكردن ب. شیركی نیەت و ویست ومەبەست ج. شیركی گوێڕایەڵی كردن د. شیركی خۆشویستن.

٢- شیركی بچوك: هەموو شتێكە باڵی بكێشێت بۆ ناو شیركی گەورە و هۆكارێك بێت بۆ كەوتنە ناو شیركی گەورە، وەك ڕیایی وسوێند خواردن بە غەیری الله وەك بڵێت "ئەگەر الله و تۆ ویستتان" یان بڵێت "پشت بەتۆ و بە الله دەبەستم" چەندین شتی تر كە بەشێكی كەمی

موسڵمانان لێی سەلامەت دەرچوون کەفارەتەکەشی بریتیە لە وتنی«پەروەردگار خۆمدەپارێزم بە تۆ لە کردنی شیرکێك کە بیزانم، وداوای لێخۆشبوونی شیرکێکت لێدەکەم کە نایزانم». [ئیمام ئەحمەد گێڕاویەتیەوە]

## بابەتی هەشتەم: جۆرەکانی کوفر:

١- کوفری گەورە لە ئیسلام دەردەچێت: ئەویش پێنج جۆرە، لەوانە: أ- کوفری بەدرۆخستنەوە. ب- کوفری پشت تێکردن وخۆبەزل زانین. جـ- کوفری گومان وڕاڕایی. د-کوفری ڕوو وەرگێڕان لە ئایین. ه- کوفری دووڕوویی.

٢ـ کوفری بچوك لە ئیسلام ناتخاتە دەرەوە: ئەویش کوفری نیعمەتە بە بەڵگەی قورئان پەروەردگار دەفەرموێت: {وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلاً قَرْيَةً كَانَتْ آمِنَةً مُّطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَداً مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ اللَّهِ فَأَذَاقَهَا اللَّهُ لِبَاسَ الْجُوعِ وَالْخَوْفِ بِمَا كَانُواْ يَصْنَعُونَ} [النحل: ١١٢].

## بابەتی نۆیەم: جۆرەکانی دووڕوویی:

١- دووڕوویی گەورە لەبیرو باوەڕ: کە بریتیە لە شاردنەوەی کوفر لە ناو دڵ وپیشاندانی ئیمان لەسەر زارەکی و ئەنجام دانی بەندایەتیەکان بە لاشە، وە شەش جۆری هەیە، خاوەنەکەی لە قوڵایی هەرە خوارەوەی دۆزەخە، ئەوانیش: أ- بەدرۆ خستنەوەی پێغەمبەرﷺ ب- بەدرۆ خستنەوەی هەندێک لەوەی بۆ پێغەمبەرﷺ ڕەوانە کراوە. ج- ڕق لێبوونەوەی پێغەمبەر. د- ڕق لێبوونەوەی هەندێ لەوەی بۆ پێغەمبەرﷺ نێردراوە. ه- دڵخۆش بوون بە سەرنەکەوتنی ئاینی الله. وـ حەزنەکردن بە سەرکەوتنی ئاینی الله.

٢- دووڕوویی بچوك لە کرداردا: ئەمەشیان بە ئەنجامدانی کارێك لە کارەکانی دووڕووەکان یان سیفەتێک لە سیفەتەکانیان، بەهێشتنەوەی ڕەگی ئیمان لە دڵدا، ئەویش پێنج جۆرە پێغەمبەرﷺ باسی کردوە بۆمان دەفەرموێت: «نیشانەکانی دووڕوو سیانن: ئەگەر قسەی کرد درۆ دەکات، ئەگەر بەڵێنی دا نایگەیەنێتە سەر، ئەگەر کرا بەدەستپاك ناپاکی دەکات» وە لەگێڕانەوەیەکی تردا: «ئەگەر کرا بەدادوەر خراپە دەکات، وە ئەگەر پەیمانی دا غەدر وناپاکی دەکات» [متفق عليه].

## بابەتی دەیەم: مانای تاغوت وسەرەکانی وجۆرەکانی:

یەکەم شت الله تعالى لەسەر نەوەی ئادەمی فەرز کرد بریتی بوو لە کوفرکردن بە تاغوت بە بەڵگەی ئەو ئایەتە: {وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولاً أَنِ اعْبُدُواْ اللَّهَ وَاجْتَنِبُواْ الطَّاغُوتَ} [النحل: ٣٦]، چۆنیەتی کوفر کردن بەتاغوت بەم شێوەیە کە بەندایەتی کردن بۆ جگە لە الله بەناڕەوا بزانیت ودور کەویەوە لەو جۆرە بەندایەتیە وە ڕقت لێی بێت وئەنجامدەرانی بە کافر بزانی ودوژمنایەتیان بکەیت، سیفەتی باوەڕبوون بە (الله)ش بەشێوەیەکە کەبیروباوەڕت وابێت تەنها الله پەرستراوی بەحەقە، هەموو بەندایەتیەك تەنها بۆ ئەو ئەنجام بدەیت، هەموو پەرستراوێکی تر لابدەیت، لە پێناو ئەودا بەندەکانیت خۆش بوێت وڕقت لە دوژمنانی ئەو بێت.

تاغوت: بریتیە لەسنور لادانی بەندەیەك بۆ ئاستی پەرستراو، یان



شوێنکەوتراو، وەیان ملکەچ بۆ کراو، نمونەی تاغوتی پەرستر او شەیتانە نادیارەکانن کە فەرمان بە مرۆڤە جادووگەرەکان دەکەن بەندایەتی ئەوان بکەن ئەوانیش دەیان پەرستن، نمونەی تاغوتی شوێنکەوتراو سەرکردەکانی دەوڵەت ومەلیکەکان وئەمیرەکانن کە فەرمان بە ژێر دەستەکانیان دەکەن بەسەرپێچی کردنی شەریعەت وڕووکردنە دەستورویاسا دانراوەکان، وە دژایەتی ئەو کەسانە دەکەن کەداوا وبانگەوازی جێبەجێ کردنی دەکەن، ژێر دەستەکانیشیان شوێنیان دەکەون، نمونەی تاغوتی ملکەچ بۆکردووش: عابید و زاناکانی جوولەکە وگاور ومەلا و زاناکانی ئاینیە ئەوانەی ئەوەی الله حەرامی کردووە ئەوان حەڵاڵی دەکەن، حەڵاڵیش حەرام دەکەن، لەوەدا خەڵکی گوێڕایەڵیان دەکەن.

بەڵام موسڵمانی موەحید هەموو ئەوانە بە کوفر دەزانێ، خۆی لەوانە وشوێنکەوتوەکانیان بەری دەکات، ودژایەتی دەکات وڕقی لێیانە، ئەمە میللەت وئاینی ئیبراهیم پێغەمبەرە ﷺ، ئەوەی حەزی بە ڕێبازی ئەو نەبێت دەرون نەخۆشە، هەر ئەوەشە بە ڕەوشت جوانی ناسراوە الله تعالى لە قورئان بۆمان باس دەکات وهانمان دەدات بۆ ئەو ڕێبازە وەك دەفەرموێت: {قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَءَاؤُ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاء أَبَدًا حَتَّى تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ} [الممتحنة: ٤].

وە لە ڕێبازی ئیبراهیم ئەوەیە جەنگ وکوشتاری تاغووت ودۆستەکانی وشوێنکەوتوەکانی بکەین بۆ بەرزراگرتنی فەرمایشتی الله وەك الله تعالى دەفەرموێت: {الَّذِينَ آمَنُواْ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالَّذِينَ كَفَرُواْ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ الطَّاغُوتِ فَقَاتِلُواْ أَوْلِيَاء الشَّيْطَانِ إِنَّ كَيْدَ الشَّيْطَانِ كَانَ ضَعِيفاً} [النساء: ٧٦].

جا تاغوت زۆرن، سەرەکانیان پێنجن:

١ـ شەیتانی بانگهێشتخواز بۆ بەندایەتی جگە لە الله، بەڵگەش ئایەتی قورئانە، الله دەفەرموێت: {أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَا بَنِي آدَمَ أَن لَّا تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ} [يس: ٦٠].

جا شەیتان تاغوتی هەرە گەورەیە، کەبەردەوام هەوڵی دوورخستنەوەی خەڵك دەدات لە ملکەچ بوون بۆ فەرمانەکانی الله، بۆ ئەمەش خەڵکانێک هەن یارمەتی شەیتان دەدەن لە ڕێگرتن لە بەندایەتی کردنی الله، ئەوانیش هەر تاغوتن.

٢ـ حاکمێکی ستەمکار حوکمەکانی الله بگۆڕێت، ئەویش بە بەڵگەی ئەم ئایەتە: {أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُواْ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُواْ إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُواْ أَن يَكْفُرُواْ بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلاَلاً بَعِيدًا} [النساء: ٦٠].

٣- ئەوەی حوکم بەوە نەکات کە الله دایبەزاندووە، الله دەفەرموێت: {وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ} [المائدة: ٤٤].

جا ئەگەر حاکم یان سەرداری نەتەوەیەك حوکمی نێوان دوو دوژمنداری کرد بەیاسایەکی دانراو یان داب ونەریتێکی خێڵەکی؛ ئەوا لە



ئاین هەڵگەڕاوەتەوە وبوە بە تاغوت..

ئەو حاکمەی لەسەر حوکمی الله نەڕۆیشت کافرە، ئەوەشی کاری بردە بەردەمی ئەم حاکمە کافرە، الله تعالى دەفەرموێت: {فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّىَ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُواْ فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجاً مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيماً} [النساء: ٦٥]، الله تعالى ئیمانی لەسەر لادان لەبەر ئەوەی لەنێوان خۆیان بە حوکمی پەروەردگار نەڕۆیشتن بە ڕێوە، هەر بەوەش نەوەستان بەڵکو ڕوویان کردە حوکمی تاغوت.

٤- ئەوەی بانگەشەی زانینی شتە نادیارەکان بکات، بەڵگەش ئەم ئایەتەیە: {قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّهُ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ} [النمل: ٦٥]، لەبەر ئەوە هەر کەسێك بانگەشەی ئەوە بکات شتی نادیار دەزانێت ئەوە تاغوتە وتەواوی قورئانی پیرۆزی بەدرۆ خستۆتەوە.

پێویستە موسڵمان ئاگاداربێت لە چوون بۆ لای ئەو کەسانەی بانگەوازی شتی نادیار دەکەن وەك جادووگەر وتەڵەکەبازو فێڵبازەکانیان، وە باوەڕیان پێنەکات، چونکە "هەر کەسێک بچێتە لای ئەوانە، وە باوەڕ بەقسەکانی بکات ئەوا کوفری کردوە بەوەی بۆ پێغەمبەر ﷺ ڕەوانە کراوە " [ئەحمەد گێڕاویەتیەوە و شوعەیب ئەرنەئوت بەچاکی داناوە].

٥-هەر کەسێك بپەرسترێت لە شوێنی الله وئەویش ڕازی بێت بەو بەندایەتیە، یان خەڵک بانگهێشت بکات بۆ پەرستنی خۆی، وەك الله دەفەرموێت: {وَمَن يَقُلْ مِنْهُمْ إِنِّي إِلَهٌ مِّن دُونِهِ فَذَلِكَ نَجْزِيهِ جَهَنَّمَ كَذَلِكَ نَجْزِي الظَّالِمِينَ} [الأنبياء: ٢٩].

جا بەندایەتی کردن مافێکی تەنها الله تعالى یە، بۆ کەس نیە داوای ئەوە بکات بیپەرستن، یان کەسێکی تر جگە لە الله بپەرسترێت، هەر کەسێك وا بکات یان وای نەکرد بەڵام ڕازی بوو بەو بەندایەتیەی بۆ جگە لە الله ئەنجام دەدرێت، ئەوا ئەویش تاغوتە.

بۆیە مرۆڤ بە ئیماندار لەقەڵەم نادرێت ئەگەر کوفر نەکات بە تاغوت، بەڵگەشمان ئەم ئایەتەیە پەروەردگارە دەفەرموێت: {لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىَ لاَ انفِصَامَ لَهَا وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ} [البقرة: ٢٥٦]،مەبەست لە "الرشد" ئاینی پێغەمبەرە ﷺ وە "الغى " ئاینی ئەبو جەهلە، "العروە"ش شایەتمانە بە "لا اله الا الله" یە، هیچ بەندەیەکیش دەستگر نابێت بەو بنەما ئیمانیە(تەوحید) هەتاوەکو دوو سیفەتی تێدا نەبێت ئەوانیش: کوفر کردن بە تاغوت، وە باوەڕ هێنان بە الله تعالى.

والحمدُ للَّه رب العالمين

والصلاةُ والسلامُ على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين



# دە بابەت

# لە بواری عەقیدە

نابێت موسڵمان نەیزانێت

واجبە لەسەری فێری بێت

مكتبة الهمّة

الدولة الإسلامية

جمادى الأولى ١٤٣٦هـ